

حکومەتی هەرێمی کوردستان
وەزارەتی ڕۆشنبیری
بەڕێوەبەرایەتی گشتیی چاپ و بلاوکردنەوە
زنجیرە (٣٩٠)

# ئاموزشی دەف

کەیوان عەلی محەمەدی

سلێمانی ٢٠٠٥

**ئامۆزشی دەف**

نووسینی: کەیوان عەلی مەمەدی

بابەت: مۆسیقا

تایپ: پەیام ئەحمەد

نەخشەسازی کۆمپیوتەر: مەهری ئەحمەد

هەڵەبڕی: نووسەر

سەرپەرشتیاری چاپ: سەلام فاتح

نەخشەسازی بەرگ: دیاری جەمال

چاپ: چاپخانەی روون

تیراژ: ١٠٠٠ دانە

ژمارەی سپاردن: (٨٨٩)ی ساڵی ٢٠٠٥ی وەزارەتی رۆشنبیری پێدراوە

# پێشەکی:

مەبەست لەم نامیلکەیە پێگەیاندنی قوتابی و خوێندکارانی گەنج و منداڵە بە ئامادەکردنی چەند پێشەکییە سادەو ئاسان کە خزمەت بە فێربوونی دەف لێدان بکات، ئەم کارە بۆ نەوجەوانانی کەم تەمەن و تەنانەت منداڵان ئامادە کراوە، لەبەر ئەوە رادەی پێشکەوتن تیایدا بە گوێرەی توانا لە هەموو نامیلکەکەدا وردە وردە دەڕوتە پێشەوە. لەم رووەوە ئاساییە کە هەندێ گرفت و کێشەی کارو داهێنانی وەك رازاندنەوە و شتی تر، نەدەکرا لە دوو توێی ئەم نامیلکەیەدا دەربکەوێ.

## کورتەیەك لە مێژووی دەف:-

کورتە مێژووی دەف لەسەردەمانی مێژوودا، بە گوێرەی ئەو باسانەی کە لە رۆژگارە کۆنەکانەوە لە شیعرو چامەکانی سەر زەوی ئێرانەوە پێمانگەیشتووە ئەوەیە کە ڕێو رەسمی جەژنی نەورۆز و سەری ساڵی پارسییەکان لەسەردەمی پاشایەتی ساسانیو ئەشکانییەکاندا، بە ئاوازی شکۆمەندی دەف دەستی پێکراوە،. دەف لە ئێراندا لەسەردەمی فەرمانڕەوایی ساسانیو ئەشکانییەکاندا هاوڕێ لەگەڵ سروودی خەسرەوانیو بە کۆمەڵ لە ئاتەشگای زەردەشتییەکاندا سوودی لێوەرگیراوە. دەف بەهۆی موسڵمانەکانەوە لە ئەوروپا برەوی پەیداکردو لەسەدەی یانزەی زاینی دا پشتگوێخرا، بۆ جارێکیتر لەسەدەی حەڤدەی زایینیدا جارێکیتر بەهۆی تورکە عوسمانییەکانەوە برەوی پەیداکردەوە.

دەف وەك ئامێرێکی موسیقی ئاسایی لە ناوچەی کوردستاندا:

دەف لەم رۆژگارەدا لەهەموو خانەقاکانی کوردستاندا سوودی لێ وەردەگیرێتو دەبێتە هۆی حاڵ لێهاتنی خواناسانی مەستو سەرخۆشی خوا پەرستی. دەفژەنانی بە توانا لەگەڵ ئاوازی تاسو شمشاڵو بەدەنگی گۆرانی بێژانێك کە بە شێوازی ناوچەییو هەندێ جار بە زمانی فارسی گۆرانییان دەگوت و ئەو ناوەیان نوقمو پڕدەکرد لە عەشقو سەرگەرمیو مۆسیقا.

لەمڕۆدا دەف لە کوردستاندا بە هیمەتی سۆفییە لێهاتووەکانی وەك خەلیفە کەریمو خەلیفە میرزا ئاغا غەوسیو شێخ عەبدولرەحمانو هیتر لە تەکیەو خانەقاکاندا، لە پاڵ مۆسیقای ئاساییو ناوچەیی شوێنی خۆیان کردۆتەوە.

دەف لە رابووردوویەکی نادیاردا سوودی زۆری هەبووە، بەتایبەت کاتێك کە گەنجێکی تازە پێگەیشتوو جیهان بە جێ دێڵێو دەمرێ، لە بردنیا بۆ گۆڕستان لە پێش دارەمەیتەکەوە دەف لێدەدرێ، هەروەها کاتێك کە حاجییەکان لە مەککە گەڕاونەتەوە خەڵك وەك دەربڕینی خۆشی و بەبەرەکەتی ئەوانەوە دەفیان لێداوەو بەزمیان گێڕاوە.

جگە لەوە ئەو دەروێشانەی بۆ سەردانی ئارامگا یا دیداری پیاوە ئایینییە گەورەکانیان دەڕۆیشتن بۆ شاری سلێمانی یان کەرکوك، لەکاتی بەڕێکردنیان یا پێشوازی کردنیاندا دەفیان لێدەداو رستەی ( یاهو، یا من هو یامن لیس الا هو) یان دەگوتو دەستیان دەکرد بە زیکرکردن. لە تەکیەو خانەقاکانی کوردستاندا ڕیتمو شێوازێکی تایبەتی هەیە بۆ زیکرکردنی دەروێشەکان، بریتین لە: بەربەیاخی، یادایم ئەڵڵا دایم، غەیاسی، حەداری، گەرمیانی سادە، گەرمیانی ئاوێتە، لااله الا الله، حی یاقیوم، و هیتر،لە کوردستاندا لەسەر نەریتی ئیسلامو ڕێبازی باوباپیران و دەروێشەکان ڕێزێکی زۆر بۆ دەف دانراوەو گرنگییەکی تایبەت دراوە بە فێربوونو لێدانی دەف، بەڕادەیەك دەتوانین بڵێین لە هەر ماڵێکدا ئەگەر کەسێکیشیان نەبێ بۆ دەف

لێدان، وەك شتێكی پیرۆز لە ماڵەكەدا سوود لێ وەردەگیرێ ئەویش بە نووسینی چەند ئایەتێك لە قورئان، یا سیفەتەكانی خودا.

چەندەها كەسی حاڵ لێهاتوو لە كۆڕی زیكردا لەبەر( شدت التهاب جانشان بەبیكرانگی متعمل شده است) و یەكسەر گیانیان دەرچووە. دەفژەنەكان لەم جۆرە كۆڕنەدا، پێش دەستكردن بە لێدانی دەف و دوای ئەوەش كە لێدەبنەوە، دەفەكە ماچ دەكەن و دەیخەنە سەر چاویان، ئەگەر بە هۆیەكەوە پێستی دەفەكە بدڕێ، ئەوە دەڵێن دەفەكە شەهید بووە، لەم رووەوە دەف بۆ ئێمە نرخ و بەهایەكی تایبەت بە خۆی هەیە، چونكە چووەتە ناو خوێن و ڕەگی خەڵكی كوردستان و جێی خۆی كردۆتەوە.

دەف لە ئۆركستراو مۆسیقییە گەورەكاندا جێگای خۆی هەیە، دیارە بەهۆی رۆڵی ( كامكارەكانەوە) دەف لە چوارچێوەی مۆسیقادا شوێنی تایبەتی خۆی گرتووە و وەك پایەیەكی مۆسیقا سوودی لێ وەردەگیرێت ئەم ئامێرە توانیوەتی لە چوارچێوەی خانەقاكاندا بەهۆی رۆڵی گرووپی ( غەیاسی خەلیفە میرزا ئاغە غەوسی) بە جیهانییەكان بناسرێنرێ و لە چوارچێوەی مۆسیقاشدا بەهۆی بلیمەتی و رۆڵی كامكارەكان و ئەحمەدی خاك ینت و كەیوان عەلی محەمەدی، كە پێنج ساڵ لەسەر یەك لەهەموو خاكی ئێراندا، پلەی یەكەمی بەدەست هێناوەو لەچەند ڤیستیڤاڵی جیهانیدا چەندین سەركەوتنی بەدەست هێناوە.



کەیوان عەلی محمدی لەساڵی ۱۳۵۳ی هەتاوی لە سنە هاتووەتە دنیاوە، ئەو هەر لەسەردەمی منداڵییەوە رووی کردۆتە جیهانی مۆسیقاو بەکارێکی گرنگی داناوە لە ژیانیدا، سەرەتای لای مامۆستا رەزا رەزایی خەریکی لێدانی سەنتور بووە، دواتر رووی کردووەتە فێربوونی ئامێری دومبەك، لای مامۆستا ( خسروژیان)و خۆیشی هەر لەتەمەنی منداڵییەوە سەروساختێکی هەبووە لەگەڵ ئامێری دەهۆڵ‌و دەفداو بەشێوەیەکی زۆر جوان پەرەی داوە بەبەهرەی خۆی لە بواری دەف لێدان‌و بەچەند شێوازی هونەری‌و تەکنیکی تایبەت بەخۆی گەیشتووەتە پلەیکی بەرز لەو بوارەدا. تا ئێستا لەچەند ( میهرەجانی فەجر) و لە دوو میهرەجانی( دفاع موقەدەس)و میهرەجانی لادێ‌و چەندین میهرەجانی پارێزگاکان پلەی‌یەکەمی بەدەست هێناوە، هەروەها لە ڤیستیڤاڵی فولکلوری یۆنان دا، بە

هاوڕێیەتی گرووپی ناوخۆی سنە، پلەی یەکەمی بەدەست هێناوە، ئێستاش سەرپەرشتیاری گرووپی دەف ژەنانی ئەندێشەو گرووپی موسیقای هەورامانی کوردستانە.



## پێناسەی دەف:

پانایی دەف لە نێوان ( ٤٥ تا ٥٤ سم ) ترەو پانایی ( کەمە ) کەی ٥-٦سم ترەو. دەف پێکهاتووە لەشەش بەش:

١- زنجیر

٢- کەمە

٣- پێست

٤-بزمار بۆ راگیرکردنی ئەڵقەی زنجیر

٥- دەنبوس

٦- شوێن پەنجەکە لەکەمەی دەفەکە دا ئەتاشرێ.

بۆ دروستکردنی دەف سەرەتا داری بی ناسك، یان نارنج، یا دارمێو دەخرێتە ناو ئاوەوە تا بە تەواوی نەرم دەبێ‌و دەخوسێت. پاش ئەوە بە ئەندازەی تایبەت دادە تاشرێت و دەخرێتە قاڵبێکی خڕەوە کە پێشتر بۆ ئەم مەبەستە ئامادەکراوە، پاش ئەوە پارچە دارەکە لە سەرەکانیەوە دە ینووسێنن بەیەکەوە وشێوەیەکی خڕ وەردەگرێ و پاشان بە هۆی بڕبەندو سمارتەوە بەتەواوی ساف دەکرێ‌و جێگەی پەنجە گەورەی دەست لە کەمە کە هەڵدەکۆڵرێ، بەدوای ئەمەدا پێستی بزنی خویَ پێوەکراو دێنن‌و بۆ ماوەی دوو رۆژ ئەیکەنە ژێر خاکەوە بۆ ئەوەی بگەنێ. پاش دوو رۆژ پێستەکە لە ژێر خاك دەردێنن‌و مووەکانی لێ ئەکەنەوە و دەیخەنە ئاو، دواتر لەبەر هەتاو دایدەنێن بۆ ئەوەی بۆنە پیسەکەی بڕواو جارێکیتر ئەیخەنەوە

ناو ئاو، دوای ئەوە بەهۆی سرێش و دەنبووسەوە ئەیچەسپێنن بە کەمە کەوە و دایدەنێنن تا وشك دەبێتەوە دوای ئەوە ئەڵقەی زنجیرەکان هەڵدەواسن بەو بزمارانەوە کە پێشتر داکوتراون بە کەمەی دەفەکەدا، هەر بزمارێك چوار ئەڵقەی پیا هەڵدەواسرێ و ئیتر دەفەکە ئامادەیە بۆ بەکارهێنان.

# چونیەتی گرتنی دەف:



١- دەستی چەپ:

دەســـــتی چـــەپ دەکەوێتـە ئاسـتی ئـەو چـالاییەی لـە کەمـەی دەفەکەدایـە بـە جۆرێك کەوانـــــەی دەفەکـــــە بکەوێتە نێوان پەنجەی گـەورەی دەسـتو پەنجەی تەنیشتی کە بە عەرەبی پێی دەڵێن (سـبابە)و بـە کـوردی پێـی دەڵـێن (دۆشـاو مـژە)وە، قورسـایی تەواوی دەفەکە دەکەوێتە سەر دەستی چەپ.

تێبینی- لەکاتی دەف لێداندا پەنجەی تەنیشتی پەنجە گەورە (دۆشاومژە)، نانووسێ بە دەفەکەوە.



٢- دەستی راست:

لـــــەم حاڵەتـــــەدا نەرمـەی پەنجـە گـەورە دەنووســێ بـە کەمـەی دەفەکـەوە، واتـە ئەگـەر بازنەی دەفەکە وەك

سـەعاتێك دابنـێین، دەبـێ پەنجـەی گـەورەی دەسـتی ڕاسـت دابنرێ لەسەر شوێنی سەعات نۆ و لـە كـاتی دەف لێدانـدا، نابـێ پەنجەی گەورەی دەستی ڕاست سەرو خوار بكا.

**٣- ئە نجامدانی كناره:**



بـۆ ئەنجامـدانی كنـاره لــە پەنجــەی ناوەڕاســتی دەسـتی ڕاسـت سـوود وەر دەگــــیرێ و لێدانەكــــەش دەبــــێ لەســــەر پێســــتی دەفەكـە بـێ كـە لـە نزیكـی كەوانەكەیەوە، دەبێت

لەوەش ئاگاداربی كە لەكاتی لێدانی ئەم نۆتـەدا پەنجـەی گـەورە سەروخوار نەكاتو دەنگی ئەم نۆتە بە تەواوی هێواش بێ.

**٤- ئە نجامدانی زنجیر:**



جوولانــەوەی چــوونو هاتنەوەی دەفەكە لـەكاتی بــەرز كردنــەوەو هێنانــە خوارەوەیدا دەنگێك پەیدا دەكـا كـە پێـی دەگـوترێ زنجیر.

٥- ئه‌نجامدانی شلاقی:



لـه‌م حاڵه‌تـه‌دا كـه‌ بـــه‌هۆی ده‌ســـتی ڕاسـته‌وه‌ په‌یـدا ده‌بـێ په‌نجـــه‌كان بـــه‌ پـێـچـــه‌وانـــه‌ی جووڵانـه‌وه‌ی تم كـه‌ داخـراون، ده‌كرێنـه‌وه‌، ده‌نگـی ئـه‌م نۆتـه‌ هێواش‌و وه‌ك ده‌نگی نه‌ به‌رزو نه‌ نزم وایه‌.

٦- ئه‌نجامدانی ڕیزپڕ:



بۆ ئه‌نجامـدانی ئه‌م به‌شـه‌ لـه‌ په‌نجـه‌كانی هـه‌ردوو ده‌سـت بـه‌ڕیز ده‌ستی ڕاست‌و پاشـان ده‌سـتی چـه‌پ سـوود وه‌رده‌گـیرێ. ڕیــز پــڕ به‌مــجۆره‌یـــه‌ كـــه‌ یه‌كه‌مجار په‌نجه‌كانی چواره‌م، سێهه‌م، دووهه‌م، یه‌كه‌م ی ده‌ستی ڕاسـت بـه‌ڕیز ده‌خرێنـه‌ سـه‌ر پێسـتی ده‌فه‌كـه‌. ده‌سـتی چـه‌پیش هـه‌روه‌ها بـه‌ بـه‌رده‌وامی له‌گـه‌ڵ جووڵانـه‌وه‌ی مه‌چـه‌ك ده‌دا لـه‌ پێسـتی ده‌فه‌كـه‌. لێـدانی ده‌فه‌كـه‌ش بـه‌ شـێوه‌ی ڕاسـت، چـه‌پ، ڕاست، چه‌پ ده‌بێ.

٧- ئه نجامدانی ریز کناره:

ئەمە بەهۆی پەنجەی ناوەڕاستو پەنجەی (براتووتە)ی دەستی ڕاستو سێ پەنجەی دەستی چەپەوە ئەنجام دەدرێ.

٨- ئه نجامدانی کرفته:



لەم حاڵەتەدا بە بەردەوامی بەسێ پەنجەی دەستی چەپ دەدرێ لە پێستی دەفەکەو دەستی ڕاستیش پێستەکە دەگرێو دەفەکە وەك نیمچە پاڵ کەوتنێكو بەم شێوەیە نیشان دەدرێ.

٩- ئه نجامدانی دووانه:

بۆ ئەنجامدانی ئەم حاڵەتە لە پەنجەکانی هەردوو دەستی چەپو ڕاست سوود وەردەگیرێ. هەردوو دەستەکە لەکاتی لێدانی دەفەکەدا یەك دەنگ لە پێستەکە بەرز دەبێتەوە.

١٠- ئه نجامدانی زنجیری پاڵ کەوتوو:



بۆ ئەنجامدانی ئەم شێوەیە دەفەکە بە تەواوی ڕووەوخوار دەکرێتەوەو ئەڵقەکان دەکەون بەسەر پێستی دەفەکەدا.

### ١١- لێدان( پێشکەش کردنی ) تم :



ئـــەم جۆرەیـــان دەبێـــت هەرچوار پەنجەکەت بەیەکەوە نوســـابێت لەســـــەر رووی دەفەکــەو پاشــان دەســت دە جوڵێنیــت لەســـەرەوە بــۆ خوارەوە لەسەر رووی پێستی دەفەکە.

### ١٢- ئە نجامدانی میانە :



هەرســـیٚ پەنجـــەی دەســـتی چـــەپ دەبێــت کــراوە بێــت شــێوازێکی هـــاتنو چـــوونی هەیـــە لەســـەر رووی پێســـتی دەفەکە.

**نیشانەکان...**

١- ئەکسان (د)، هەر کاتێك ئەم نیشانەیە لەسەر یەکێك لە نۆتەکان دانرا، ئەوە دەبێ ئەو (نۆتە)یە بەتواناو هێزێکی زیاترەوە لێبدرێ.

٢- پیش ریز: هەر کاتێك مەبەست بێ ریز لەگەڵ توم دا دەست پێ بکرێت لەم نیشانەیە ( ــ )و ئەگەر لەگەڵ (بك) دابێ لەم نیشانەیە سوود وەردەگیرێت(ــ).

٣- هەر کات لەژێر هەرکام لە نۆتەکاندا گەیشتین بە نیشانەی (×) ئەو نۆتە بە شێوەی شلاقی لێدەدرێت.

٤- هەرکات لەسەر هەرکام لە نۆتەکان نیشانەی (٨) دانرا ئەو نۆتە بەشێوەی (بك)ئەنجام دەدرێ.

٥- هەرکات لەژێر هەرکام لە نۆتەکاندا نیشانەی (٧) دانرا ئەو نۆتە بەشێوەی زنجیر لەگەڵ لێداندا ئەنجام دەدرێ.

٦- هەرکات لەژێر هەرکام لە نۆتەکاندا نیشانەی ( ○ ) مان بینی ئەو نۆتە بەشێوەی زنجیر بەبێ لێدان ئەنجام دەدرێ.

٧- هەرکات لەسەر هەر نۆتەیەك نیشانەی ( Ⓨ ) دانرا ئەو نۆتە بە شێوەی گرفتە ئەنجام دەدرێ.

٨- هەرکات لە تەنیشتی هەریەك لە نۆتەکان خاڵێك دانرا، ئەوە دەبێ نیوەی درێژە پێدانی ئەو نۆتە بخرێتە سەر خۆی.



**دووبارە بوونەوەکان:**

١- دووبارە بوونەوەی خانەی (باڕ) دوایین.



٢- دووبار بوونەوەی دووخانەی دوایین.



٣- خاڵی دووبارە بوونەوە.



٤- دوولا هێڵی کۆتایی.



١- چەند پێناسەیەکی گشتی دەربارەی وەزن.

ا- وەزن (ایقاع) جۆرێکە لە گونجان.

ب- وەزن ڕێکوپێکی و گونجانێکە لەنێوان درێژە پێدانەکەدا.

ج- وەزن هەست پێکردنێکە کە پەیدا دەبێ بەهۆی بەدوای یەکدا هاتنی لێدانی بەهێزو لەسەرخۆ.

د- وەزن گونجانێکە لە کاتا.

ه- چون یەکنەبوونی نۆتەکان لەبارەی کاتەوە وەزن پەیدا دەکا.

وەزن:

مەبەست لە وەزن لە مۆسیقادا، بەکاربردنی دەنگ و ڕاوەستانەکانە بە درێژە پێدانە جۆراوجۆرەکانەوە کە لە بارەی کاتەوە گونجاوبن لەگەڵ یەکتردا.

بۆ دیاری کردنی درێژ بوونەوەی دەنگەکان، حەوت شێواز بەکار دەهێنرێن بەم شێوانەی خوارەوە.

| | | |
|---|---|---|
| ١- نۆتی خڕ. | 𝅝 | یەکەیەکی مۆسیقا |
| ٢- نۆتی سپی | 𝅗𝅥 | نیو یەکەی مۆسیقا |
| ٣- نۆتی ڕەش | ♩ | چوار یەك |
| ٤- نۆتی چەنگ | ♪ | هەشت یەك |

٥- نۆتی دوولا چەنگ یەك لەسەر شانزە

٦- نۆتی سی لا چەنگ یەك لەسەر سی و دوو

٧- نۆتی چوارلا چەنگ یەك لەسەر شەستو چوار

## بێدەنگیو راوەستانەکان:

بەرامبەر درێژ کردنەوە جۆراوجۆرەکانی دەنگەکانو بەمەستی جیاکردنەوەی دەنگەکان لەیەکتر چەند نیشانەیەك بۆ ئەو ڕاوەستانانە بەکار دەهێنرێن، بەهەمان ئەو ناوانەی لە مۆسیقادا بەکارهێنراون کە بریتین لە: ڕاوەستانی خڕی دوو چەندان (بە ئەندازەی هاوسان لەگەڵ دوو بەرامبەری خڕدا) راوەستانی خڕ، راوەستانی سپی، راوەستانی رەش، راوەستانی چەنگ، راوەستانی دوولا چەنگ، راوەستانی سیلا چەنگ، راوەستانی چوارلا چەنگ، وەك لە خوارەوەدا نەخشەی کێشراوە.



| راوەستانی خڕی دووچەندان | نۆتی خڕی دووچەندن |
| --- | --- |
| راوەستانی خڕی یەك | نۆتی خڕ |
| راوەستانی سپی دوو | نۆتی سپی |
| راوەستانی رەش | نۆتی رەش |
| راوەستانی چەنگ | نۆتی چەنگ |
| راوەستانی دوولا چەنگ | نۆتی دوولا چەنگ |
| راوەستانی سی‌لا چەنگ | نۆتی سی‌لا چەنگ |
| راوەستانی چوارلا چەنگ | نۆتی چوارلا چەنگ |



زنجیری پاڵکەوتوو



میانە

